به نام خدا


| | | |
|---|---|---|
| سرشناسه | : | علوی‌فرد، یحیی |
| عنوان و نام پدیدآور | : | برگ و سیب/ شاعر یحیی علوی‌فرد. |
| مشخصات نشر | : | قم: انتشارات عمو علوی، ۱۳۹۱. |
| مشخصات ظاهری | : | ۴۸ص. |
| شابک | : | ۹۷۸-۶۰۰-۹۲۲۸۲-۶-۳ |
| وضعیت فهرست نویسی | : | فیپا |
| یادداشت | : | کردی. |
| موضوع | : | شعر کردی -- قرن ۱۴ |
| موضوع | : | شعر کردی -- قرن ۱۴ -- ترجمه شده به فارسی |
| رده بندی کنگره | : | ۱۳۹۱ ک۴۴۳ع۸/PIR ۳۲۵۶ |
| رده بندی دیویی | : | ۸فا۹/۲۱ |
| شماره کتابشناسی ملی | : | ۲۸۳۰۵۵۷ |


# شەلپە و سێڤ

هەلبەستێن نووجوانان


هەبەستڤان : یەهیا ئەلەوی فەرد

گرافیک : صادق نوری

وەشانخانە : ئەموو ئەلەوی

سال : ۲۰۱۲



مالپەر : www.alavifard.com

ئە-نامە: johnfard@yahoo.com

+٩٨٩١٢٦٥١٥٤٢٩



قیمت: ۴۰۰۰ تومان



## Jîyana Yehya Elewî Ferd

Yehya Elewî Ferd yek ji helbestvan , rojnameger û nivîskarên kurdên kurmanc e li Îranê ye. Di sala 1973'yan de, li gundê Baxçixê a ku li ser Bocnûrd li parêzgeha Xorasana Bakur li Îranê ji dayîk bûye. Ev 20 sal in helbestên zarokan û nûciwaû nan bi çar zimanên: Kurdîya kurmancî û farisî û erebî û inglîsî dinivîse. Wî bêhtirî 10 xelatên helbestan li Îranê hilgirtiye. Ew niha li bajarê Qomê jiyan dike. Heta nika bêhtirî deh pirtûkên wî li Îranê , Îngilistanê , Iraqê û Tacîkistanê hatine çap kirin.

## Biographi of Yahya Alavi Fard

Yahya Alavi Fard a Kurdish Poet, Writer, and Jornalist in Iran. he was born in 1973 in Baghchegh village, Bojnurd, North Khorasan Province, hi compose poems for kids and youth from 20 years in four languages : Kurmanji, Persian, Arabic, and English.

he won tens of prizes in iran. now He lives in qom. he published more than ten books in Iran, Iraq, Tagikistan, and England.

## ژیيانا یەهیا ئەلەوی فەرد

یەهیا ئەلەوی فەرد یەک ژ هەلبەستڤان ، ڕۆژنامەگەر و نڤیسکارێن کوردێن کورمانج ئە ل ئیرانێ یە. د سالا ١٩٧٣یان دە، ل گوندێ باغچقێ ئا کو ل شەر بۆجنوورد ل پارێزگەها خۆراسانا باکور ل ئیرانێ ژ داییک بوویە. ئەڤ ٢٠ سال ئن هەلبەستێن زارۆکان و نووجوانان ب چار زمانێن: کوردییا کورمانجی و فارسی و ئەرەبی و ئنگلیسی دنڤیسە. وی بێهتری ١٠ خەلاتێن هەلبەستان ل ئیرانێ هلگرتیە. ئەو نها ل باژارێ قۆمێ ژیان دکە. هەتا نکا بێهتری دەە پرتووکێن وی ل ئیرانێ ، ئینگلستانێ ، ئراقێ و تاجیکستانێ هاتنە چاپ کرن.

## زندگی نامه یحیی علوی فرد

یحیی علوی فرد یکی از شاعران ، نویسندگان و روزنامه نگاران کرد ایرانی است . در سال ١٣٥٢ (١٩٧٣) در روستای باغچق ، بجنورد ، خراسان شمالی ، ایران به دنیا آمده است . او ٢٠ سال است که برای کودکان و نوجوانان به چهار زبان : کردی ، فارسی ، عربی و انگلیسی شعر می سراید. او ده ها جائزه شعر در ایران گرفته است . او هم اکنون ساکن قم است . تا الآن ده ها کتاب از او در ایران ، انگلستان ، عراق ، و تاجیکستان به چاپ رسیده اند.

## Mêrek delal

Mîna par û pîrarê
Îsal baran nabarê
Hewa îsal nexweş e
Wa sala gewr e reş e
Lila dengî xwe berde
Dila me tijî derd e
Dengî xwe hey ke bajû
Wa salai reş pirr najû
Wa sali rûreş dibe

Sibe hewa xweş dibe
Dîsa haka namînê
Sibe baran dixwînê
Gewrî daran şil dibe
Çul tijî bilbil dibe
Sibe tê avî zelal
Sibe tê mêrek delal
Bi hespi tê nav malan
Çi ke xirabîya salan

## A dear man

This year does not rain like last years. In this year the weather is unwell. This year is gray and black. Hey! Let free your voice. our hearts are full of pain. Hey loud your voice now, which these years will not remain. this year will be black face and tomorrow a good weather will come back. It does not stay like this. tomorrow the rain will sing and the trees will be more Watered. And plains are full of the nightingale. Tomorrow will be clear by water. Tomorrow will come back a dear man. He will come with his horse to villages to make The fails of these years .

## مێرەک دەلال

مینا پار و پیرارێ
ئیسال باران نابارێ
هەوا ئیسال نەخوەش ئە
وا سالا گەور ئە ڕەش ئە
للا دەنگی خوە بەردە
دلا مە تژی دەرد ئە
دەنگی خوە هەی کە باژوو
وا سالا ڕەش پڕ ناژوو
وا سال ڕوورەش دبە

سبە هەوا خوەش دبە
دیسا هاکا نامینێ
سبە باران دخوینێ
گەوری داران شل دبە
چول تژی بلبل دبە
سبە تێ ئاڤی زەلال
سبە تێ  مێرەک دەلال
ب هەسپ تێ ناڤ مالان
چ کە خراببیا سالان

## مردی عزیز

مثل پارسال و پریسال ، امسال باران نمی بارد . هوا امسال ناخوش است . این سال خاکستری ، سیاه است . آهای ! صدایت را رها کن ، که دل ما پر از درد است . صدایت را هی کن و بران ، که این سال ها زیاد دوام نمی‌آورد. این سال روسیاه خواهد شد و فردا هوا خوش می شود . باز این طور نمی‌ماند فردا باران می خواند و گلوی درختان تر خواهد شد . و دشت ها پر از بلبل می شوند . فردا آب زلال خواهد آمد . فردا مردی عزیز می آید . با اسبش میان خانه ها می آید تا خرابی این سالها را بسازد .

## Tila û tila

Tila bi dê ra çû tila bikirrê
Tila ku dî dîkan bû tijî çirrê

Got : diya min çima tila haka ne
Xaltî û met çima tijî tila ne

Çima tila veqes dirav dixwazê
Bi wî dirava bavî min bû tazê

Di kennî got: çima bixwe haka yî
Tu sa mira bixwe tîkek tila yî

Tila : Zîv

## Gold and miss Gold

miss gold went with his mother to buy gold. When she saw the gold, the shopstore was filled with noise. "My mother! Why is it gold?" She Said "Aunts and uncles are so full of gold? Why gold will be so much money? With this money, my father was naked." His mother laughed and told :" Why are you! You're my one piece of gold ."

## تلا و تلا

تلا ب دێ ڕا چوو تلا بکڕێ
تلا کو دی دیکان بوو تژی چڕێ

گۆت : دیا من چما تلا هاکا نه
خالتی و مەت چما تژی تلا نه

چما تلا ڤەقەس دراڤ دخوازێ
ب وی دراڤا باڤی من بوو تازێ

د کەننی گۆت: چما بخوە هاکا یی
تو سا مرا بخوە تیکەک تلا یی

تلا : زیڤ

## طلا و طلا

طلا با مادرش رفت تا طلا بخرد . طلاها را که دید ، مغازه پر از سر و صدا شد . گفت : مادرم ! چرا طلا این طور است ؟ چرا خاله و عمه پر از طلا هستند؟ چرا طلا اینقدر پول می خواهد؟ با این پول پدر من لخت شد . مادرش خندید و گفت : چراخودت اینطورهستی؟ تو خودت برای من یک تکه طلا هستی .

## Çûçik û piŞîng

Çûçik li ber darek û
PiŞîng liber darek din

Aram diçû niçîr ke
Çûçiki sa parek din

Gut ku : lavi pilingim
Îro dikem karek din

Wî bazda û çûçik çû
RûniŞt li ser darek din

: PiŞîngi gut ji Şerman
Îro nebû , carek din

## Sparrow and cat

Sparrow under a tree, and a cat under another tree, the cat went down to hunt the Sparrow for a another food shift. He said :" I am son of tiger and now I will do something else. He jumped and Sparrow went and sat on the another tree. Cat of the shame said: " now I did not succeed, but I Be successful in future day.

## چووچک و پشینگ

چووچک ل بەر دارەک ئوو
پشینگ لبەر دارەک دن

ئارام دچوو نچیر کە
چووچک سا پارەک دن

گوت کو : لاڤ پلنگم
ئیرۆ دکەم کارەک دن

وی بازدا ئوو چووچک چوو
ڕوونشت ل سەر دارەک دن

پشینگ گوت ژ شەرمان :
ئیرۆ نەبوو ، جارەک دن

## گنجشک و گربه

یک گنجشک زیر یک درخت و گربه زیر درخت دیگری ، آرام می رفت تا گنجشک را برای یک وعده دیگر شکار کند. او گفت: من پسر پلنگم و امروز کاری دیگر خواهم کرد . او پرید و گنجشک هم رفت و روی درختی دیگر نشست . گربه از خجالت گفت: امروز نشد ، یک روز دیگر .

## Dengê çîyan

Hekayeta min û te
Hekayeta kanyan e
Li beyna me çîya ket
Çîya tijî dûman e

Kanî hatine kelînê
Çûn û ji hev dûr ketin
Ji rêçûya çîyan da
Zîne zîne daketin

Dengê avê bela bû
Li nav nalan û çîyan
Şîbe çû û winda bû
Li nav xicavî mêyan

Çîya sa me dixwînin
Li benda kurdan mane
Dengê çîyan û kanîyan
Nalîna kurmancan e

## Voice of the mountains

story of me and you, the story of fountains. Mountains separate between us. The mountains are foggy. springs boiled and went and fell apart. Went a step down from the mountain corridors. The sound of water between dales and mountains and the sound were missing by loud echo of the sheep. the mountains call for us. they waiting the Kurds. Voice of the mountains and springs, are groan sound of Kurmanjs .

## دەنگێ چییان

هەکایەتا من و تە
هەکایەتا کانیان ئە
ل بەینا مە چییا کەت
چییا تژی دوومان ئە

کانی هاتنە کەلینێ
چوون و ژ هەڤ دوور کەتن
ژ ڕێچوویا چییان دا
زینە زینە داکەتن

دەنگێ ئاڤێ بەلا بوو
ل ناڤ نالان و چییان
شیبە چوو و وندا بوو
ل ناڤ خجاڤی مێیان

چییا سا مە دخوینن
ل بەندا کوردان مانە
دەنگێ چییان و کانییان
نالینا کورمانجان ئە

## صدای کوهها

قصه من و تو ، قصه چشمه هاست . کوهها بین ما فاصله انداختند . کوهها مه آلودند . چشمه ها جوشیدند و رفتند و از هم دور افتادند . از راهروهای کوهها پله پله پایین رفتند . صدای آب بین دره ها و کوهها پیچید، پایین رفت و در میان صدای گوسفندان گم شد . کوهها برای ما می خوانند . در انتظار کردها هستند. صدای کوهها و چشمه ها ، صدای نالیدن کورمانج هاست .

## Çîrok

Çîrok hatin ku berfê
Bi ser serî çîyan din
Çîrok hatin ji asmîn
Riyan li me nîŞan din

Çîrok mîna dîkan e
Sa ji xewê rakirin
Hinik li ber çîrokan
Riya xwe peyda kirin

Hinik çûn û hinik man
Li ortî ri daketin
Hatin li ber çîrokan
Mîna xizîn raketin

## Story

Stories came to push the snow over the mountains. They Came down from heaven to show us the ways. The story is like a rooster to wake up from sleep. Some of the humen found their way by listening stories. Some went and some stayed and were way off. They came and slept like a child by listening stories.

## چیرۆک

چیرۆک هاتن کو بەرفێ
ب سەر سەری چییان دن
چیرۆک هاتن ژ ئاسمین
ڕیان ل مە نیشان دن

چیرۆک مینا دیکان ئە
سا ژ خەوێ ڕاکرن
هنک ل بەر چیرۆکان
ڕیا خوە پەیدا کرن

هنک چوون و هنک مان
ل ئۆرتی ڕ داکەتن
هاتن ل بەر چیرۆکان
مینا خزین ڕاکەتن

## داستان

داستان ها آمدند تا برف بر سر کوهها بنشانند. از آسمان پایین آمدند تا راهها را به ما نشان بدهند . داستان مثل خروس است برای ازخواب بیدار کردن . بعضی از مردم راهشان را پای داستان ها پیدا کردند. بعضی رفتند و بعضی دیگر ماندند و بین راه پیاده شدند . آنها آمدند و مثل کودکان پای داستان ها خوابیدند

## Lavê kurmancan

Dinya tijî tutûn e
Dinya tijî dûlax e
Li jûr te çîyan e
Li jîr te qebax e

Veger vere bira min
Rûnê li ser karî xwe
Wana vêrxin li xwe ke
Kiras û Şîlvarî xwe

Wa çi tîpe lixistî
Lila veke çavê xwe
te lavi kurmancanî
xirab neke bavê xwe

Te teze darî cayla
Bavî te kevne dar e
Bapîra te kanî ye
Dapîra te simar e

Çima wana ji bîr bûn
?Nas nakî dapîra xwe
Çima li ber nagirî
?Riçûya bapîra xwe

## Son of Kurmanjs

The world is full of smoke. The world is full of dust. Mountain is above you and bluff is below. Oh my brother! Come back and sit on your work! Draw this clothes put your shirt and pants! what is this mode, hey open your eyes! You are son of Kurmanj, do not destroy your father! You're a sapling tree, but your father is old. Your Grandfather is springs and your grandmother is river. Why were they forgotten? Why don't know your grandmother? Why not in the way of the grandfather?

## لاڤێ کورمانجان

دنیا تژی توتوون ئە
دنیا تژی دوولاخ ئە
ل ژوور تە چییان ئە
ل ژیر تە قەباخ ئە

ڤەگەر ڤەرە برا من
ڕوونێ ل سەر کاری خوە
وانا ڤێرخن ل خوە کە
کراس و شیلڤاری خوە

وا چ تیپە لخستی
للا ڤەکە چاڤێ خوە
تە لاوڤێ کورمانجانی
خراب نەکە باڤێ خوە

تە تەزە داری جایلا
باڤی تە کەڤنە دار ئە
باپیرا تە کانی یە
داپیرا تە سمار ئە

چما وانا ژ بیر بوون
ناس ناکی داپیرا خوە؟
چما ل بەر ناگری
ڕچوویا باپیرا خوە؟

## پسر کورمانج ها

دنیا پر از دود است . دنیا پر از گرد و غبار است . بالای سر تو کوههایند و زیر پای تو پرتگاه ها . برگرد و بیا ای برادر من ! سر کارت بنشین ! اینها را دربیاور و پیراهن و شلوارت را بپوش ! این چه تیپی است که زده ای ، آهای چشم هایت را باز کن ! تو پسر کورمانج ها هستی ، پدرت را خراب نکن ! تو یک درخت تازه و جوان هستی اما پدرت درختی کهنسال است . پدربزرگت چشمه است و مادربزرگت رودخانه . چرا اینها فراموش شدند؟ مادربزرگت را نمی شناسی ؟ چرا راه پدربزرگت را در پیش نمی گیری ؟

## Ceng

Dîsa xizan dilîzin
Li ortî koççi ceng e
Dengî xizîn tifang e
Xicawî wan fişeng e

Lîstikî wan birefş e
Xicawî wan bilind e
Kes li vira nekuştin
Çiqes va cenga rind e

Heger tifang û fişeng
Bibi xicaw, bibi deng
Ez ji xwedê dixwazim
Dinya bibi tijî ceng

## War

The kids are playing.in alley is a war. Children's voices and clamors are gun and ball cartridge. Their play is nice and their voices are loud. Who here can not be killed. Oh, how this war is good! If the sound and clamors Alternative the cartridges and guns, I want God to .the world is full of war

## جەنگ

دیسا خزان دلیزن
ل ئۆرتی کۆچچ جەنگ ئە
دەنگی خزین تفانگ ئە
خجاوی وان فشەنگ ئە

لیستکی وان برەفش ئە
خجاوی وان بلند ئە
کەس ل ڤرا نەکوشتن
چقەس ڤا جەنگا ڕند ئە

هەگەر تفانگ و فشەنگ
بب خجاو، بب دەنگ
ئەز ژ خوەدێ دخوازم
دنیا بب تژی جەنگ

## جنگ

باز بچه ها بازی می کنند . توی کوچه جنگ است . صدای بچه ها تفنگ است و فریادشان فشنگ . بازی آنها زیباست . و صدایشان بلند است . اینجا کسی کشته نمی‌شود . وای که چقدر این جنگ خوب است ! اگر صدا فشنگ باشد و آواز تفنگ ، من از خدا می خواهم که دنیا پر از جنگ باشد .

## Erd û asimîn

Danek tera dijmen e
Danek tera heval e
Demek tere li Şîb e
Demek tere hewal e

Demek sa te dixwînê
Heyluyan û kilaman
Demek tere derek dûr
Sa te diŞîna naman

HûŞî xwe pirr beref ke
Karî Şîtîn haka ye
Hat bigirê erdê me
Ji asimîn dûr maye

## Earth and Sky

it is your enemy in a time and your friend another time.sometimes goes down and tail up. sometimes sings for you and and then goes far away and sends you a letter. Gathered by your senses Now! It is the devil's work. Who came to conquer the earth, the .sky stayed away

## ئەرد و ئاسمین

دانەک تەرا دژمەن ئە
دانەک تەرا هەڤال ئە
دەمەک تەرە ل شیب ئە
دەمەک تەرە هەوال ئە

دەمەک سا تە دخوینێ
هەیلویان و کلامان
دەمەک تەرە دەرەک دوور
سا تە دشینا نامان

هووشی خوە پڕ بەرەف کە
کاری شیتین هاکا یە
هات بگرێ ئەردێ مە
ژ ئاسمین دوور مایە

## زمین و آسمان

زمانی با تو دشمن است و زمانی با تو دوست. دمی پایین می رود و دمی رو به بالا . یک دم برای تو آواز و نغمه می خواند و یک دم جایی دور می رود و برایت نامه می فرستد. حواست را خوب جمع کن ! کار شیطان این گونه است . آمد که زمین را فتح کند ، از آسمان دور ماند.

## Çîyan

Çîyan xwedênas in
Mîna îmaman in
Welatê kurdan in
Şûna kilaman in

Çîyan tijî reng in
Çîyan tijî deng in
Çîyan birayên me
Çîyan sa me xweng in

Mîna di bavek rind
Xwarin dane ber me
Ava çîyan sar e
Nanî çîyan germ e

Mîna dapîra me
Mîna bapîra me
Şûnî çîyan wextek
Nerre ji bîra me

## Mountains

Mountains are godly. like Imams. Land of Kurds place of sing. mountains are full of coulors and melodies. they are our brothers and sisters. Like a good parent, taking food for us, the mountain's water is cold and it's bread to hot. Don’t forget place of mountains such as grandparents!

## چییان

چییان خوەدێناس ئن
مینا ئیمامان ئن
وەلاتێ کوردان ئن
شوونا کلامان ئن

چییان تژی ڕەنگ ئن
چییان تژی دەنگ ئن
چییان برایێن مە
چییان سا مە خوەنگ ئن

مینا د باڤەک ڕند
خوارن دانە بەر مە
ئاڤا چییان سار ئە
نانی چییان گەرم ئە

مینا داپیرا مە
مینا باپیرا مە
شوونی چییان وەختەک
نەڕە ژ بیرا مە

## کوهها

کوهها خداشناسند . مثل امامان هستند . سرزمین کردهایند و جای آواز خواندن است . کوهها پر از نغمه و صدایند . کوهها برادران ما یند و برای ما خواهر هستند. مثل یک پدر و مادر خوب ، خوردنی به ما می دهند ؛ آب کوهها سرد است و نان شان گرم . یک وقت مثل پدربزرگ و مادربزرگ‌مان، جایگاه کوهها از یادمان نرود!

## Tirş û Şirîn

Lingê wî westîyane
Destî wî bûne kal e

Desteke wî tijî sêv
Yek tijî pirtixal e

Sêv Şirînin ew çima
Na kennê tirş û tal e

Cayla hali rûmennê
Ber bi herre hewale

Sivik bike destî wî
Bibe wî ber bi mal e

Bira demek bikennê
Kennî giran zelal e

Şirîne mîna sêvan
Li tamma pirtixal e

## Salty and Sweet

His legs are tired and her hands are old. A hand full of apples and another full of oranges. Apples are sweet, why is he salty and bitter? oh young man stand up and go to the him. Alleviate His hands, and take him home! let him to laugh couse of leader's laughing is the clear. The sweet taste of apples and oranges .

## ترش و شیرین

لنگێ وی وەستییانە
دەستی وی بوونە کال ئە

دەستەکە وی تژی سێڤ
یەک تژی پرتخال ئە

سێڤ شیرینن ئەو چما
نا کەننێ ترش و تال ئە

جایلا هال ڕوومەننێ
بەر ب هەڕە هەواله

سڤک بکە دەستی وی
ببە وی بەر ب مال ئە

برا دەمەک بکەننێ
کەننی گران زەلال ئە

شیرینە مینا سێڤان
ل تاما پرتخال ئە

## ترش و شیرین

پاهای او خسته هستند و دست هایش پیر شده اند. یک دستش پر از سیب است و یکی پر از پرتقال است . سیب ها شیرین هستند پس او چرا ترش و تلخ است ؟ ای جوان بلند شو و به سوی او بالا برو . دست هایش را سبک کن و او را به سوی خانه ببر ! بگذار کمی بخندد ؛ خنده بزرگان زلال است . مثل سیب شیرین است و به طعم پرتقال .

## Şelpe û sêv

Şelpe û sêv bi hevra
Li ser darek hişîn bûn
Bi hevra av vexwarin
Ber bi tavê kûtel çûn

Şelpe û sêv bûne sor
Ketin li ber darê xwe
Îro mirin bi hevra
Teva kirin karê xwe

Ew sêva xelkê bir û
Bi destî xwe beref kir
Şelpe li bin darê ma
Şemali bir telef kir

Hişîn bûne sor bûne
Çûne li vir nemane
Hinik natî şelpan e
Hinik mîna sêvan e

## Leaves and apple

A apple were green with a leave on a tree. they ate water with them and went up to the sun. the apple and the leave were red together and fell down. Today they and their acts together and they died. The humen took the apple and handed it to their funeral. The leave Remained under the tree and the wind took it and he died. They Are green and red and then are gone and are left here. somebody are like leave, and some like apples .

## شەلپە و سێڤ

شەلپە و سێڤ ب هەڤرا
ل سەر دارەک هشین بوون
ب هەڤرا ئاڤ ڤەخوارن
بەر ب تاڤێ کووتەل چوون

شەلپە و سێڤ بوونە سۆر
کەتن ل بەر دارێ خوە
ئیرۆ مرن ب هەڤرا
تەڤا کرن کارێ خوە

ئەو سێڤا خەلکێ بر ئوو
ب دەستی خوە بەرەف کر
شەلپە ل بن دارێ ما
شەمال بر تەلەف کر

هشین بوونە سۆر بوونە
چوونە ل ڤر نەمانە
هنک ناتی شەلپان ئە
هنک مینا سێڤان ئە

## برگ و سیب

برگ و سیب با هم روی یک درخت سبز شدند . با هم آب خوردند و به سوی آفتاب بالا رفتند . برگ و سیب با هم قرمز شدند و زیر درختشان افتادند. امروز آنها با هم مردند و کارشان را تمام کردند. مردم آن را سیب را بردند و با دست شان تشییع کردند . برگ زیر درخت ماند و باد آن را برد و تلف کرد . سبز شده اند ، سرخ شده اند ، رفته اند و این جا نمانده اند ؛ بعضی مثل برگ و بعضی مثل سیب .

## Dwîz û derew

Çull û çîya û dewar
Dwîz in derew nabîjin
Tiştî xwe wînaşîrin
Sa me xelat dirîjin

Dar û gulik dwîz dibîn
Erdi hişîn dwîz dibîn
Hesp û ker û mange jî
Mîna mîşîn dwîz dibîn

Li nav daran gir bûnî
Li nav çîyan geryanî
Riçûya me dwîz nebû
Dîsa derewîn manî

## True and lie

Deserts and mountains and cattle are truthful and do not lie. They have not hidden their gift to us. Trees and flowers are truthful. Green Mountains are truthful. Horses and donkeys are truthful, as well as sheep. We grew up between the trees and the mountains looked but did not correct the path of our lives and we stayed a liar.

## دویز و دەرەو

چوڵ و چییا و دەوار
دویز ئن دەرەو نابێژن
تشتی خوە ویناشیرن
سا مە خەلات درێژن

دار و گولک دویز دبین
ئەرد هشین دویز دبین
هەسپ و کەر و مانگە ژی
مینا میشین دویز دبین

ل ناڤ داران گر بوونی
ل ناڤ چییان گەریانی
ڕچوویا مە دویز نەبوو
دیسا دەرەوین مانی

## راست و دروغ

بیابان و کوه و چهارپایان راستگویند و دروغ نمی گویند . داشته های شان را مخفی نمی‌کنند و به ما هدیه می دهند . درخت و گل راست می گویند . کوههای سبز راست می‌گویند . اسب و الاغ و گاو نیز مثل میش ها راست می گویند . ما بین درختان بزرگ شدیم و بین کوهها گشتیم ؛ اما مسیر زندگی مان درست نشد و باز هم دروغگو ماندیم .

## Teze eyd

Dîsa teze eyd e
Dîsa kovnê tez e
Bela dikim dîsa
Şîranîyê xweşmeze

Dîsa met û xaltî
Ap û xalanê me
Beref bûn û hevra
Bûne mîvanê me

Biken metê eyd e
Biken apo rind e
Biken xalo ceşn e
Ku dil bibi zinde

Demek biken xaltî
Dîsa haka nabê
wa saline tarî
dawe teva nabê

Dilî me naxwazê
Şîranî meze kin
Dixwazi li eydê
Dilî xwe teze kin

## New Year

New Year is still open and fresh clothes. I offer delicious sweets. All of our aunts and uncles be our guests together. Oh my aunts and uncles please laugh! Couse of the laugh is really good. And it makes hearts alive. Aunt! Laugh for a moment that this species is not. It wasn't finished that dark year of fights. Our hearts will not, that you eat sweets, but wants the new, refresh your heart.

## تەزە ئەید

دیسا تەزە ئەید ئە
دیسا کۆڤنێ تەز ئە
بەلا دکم دیسا
شیرانییێ خوەشمەزە

دیسا مەت و خالتی
ئاپ و خالانێ مە
بەرەف بوون و هەڤرا
بوونە میڤانێ مە

بکەن مەتێ ئەید ئە
بکەن ئاپۆ ڕند ئە
بکەن خالۆ جەشن ئە
کو دل بب زندە

دەمەک بکەن خالتی
دیسا هاکا نابێ
وا سالنە تاری
داوە تەڤا نابێ

دلی مە ناخوازێ
شیرانی مەزە کن
دخواز ل ئەیدێ
دلی خوە تەزە کن

## عید تازه

باز عید تازه است و باز هم لباس های تازه . باز من شیرینی های خوشمزه پخش می کنم . باز عمه و خاله و عمو و دایی های ما با هم جمع شده اند و مهمان شده اند . عمه بخند که عید است ! عموجان بخند که خوب است . که جشن است تا دل زنده شود . خاله ! یک لحظه بخند که باز این گونه نمی شود . این سال های تاریک ، دعوا تمام نمی شود . دل مان نمی‌خواهد، شیرینی بخورید ؛ بلکه می خواهد که در عید ، دل تان را تازه کنید .

## Gepê kullan

Gepê çîyan berf e
Gepê cûyan av e
Gepê Şevan hêv e
Gepê rojan tav e

Gepê gulan refŞ e
Yi bilbilan deng e
Gepê daran mêv e
Gepê çûlan reng e

Kullan gepê xwe got
Gepa min û te ma
Ji me nema sa çi
Gepek li wî dinya

## Talk of all

Snow is talk of mountains. water is talk of streams,. Moon is talk of nights, and son is letter of Sun. beauty is speak of Flowers and voice is speak of nightingales. Fruit talk of trees and colors is speak of plain. They said all their letters and our talking was kept. Why we left anything out in the world?

## گەپێ کولاڵن

گەپێ چییان بەرف ئە
گەپێ جوویان ئاڤ ئە
گەپێ شەڤان هێڤ ئە
گەپێ ڕۆژان تاڤ ئە

گەپێ گولان ڕەفش ئە
ی بلبلان دەنگ ئە
گەپێ داران مێڤ ئە
گەپێ چوولان ڕەنگ ئە

کولاڵن گەپێ خوە گۆت
گەپا من و تە ما
ژ مە نەما سا چ
گەپەک ل وی دنیا

## حرف همه

حرف کوهها ، برف است . حرف جویبارها ، آب است . حرف شب ها ، ماه است و حرف روزها آفتاب . حرف گل ها زیبایی است و مال بلبل صداست . حرف درختان میوه است و حرف دشت ها رنگ است . همه حرف شان را گفتند و حرف من تو ماند . چرا در این دنیا حرفی از من تو باقی نماند؟

## Cînar

Bi gotina xelkê
Cînarî min dîn e
Serî tijî tûz e
Kurrik tijî bîn e

Solê wî diryan e
Bendi solan ve ne
Kenni wî bîrefŞ e
Kovni wî kevne ne

Îro çûme cem wî
Bû dilê min teze
Kimek sa min gep kir
Gepêne xweŞmeze

Wa xelkana sa çê
Li cem wî namînin
Cînarî min rind e
Wana bixwe dînin

## Neighbor

According to people, my neighbor is mad; head of him is full of dust and his socks are smell. His shoes are torn open and his shoelaces. Her smile isn't  beautiful and her clothes are worn. Today I went to him and I was fresh. I did a little sweet talk. Why people do not like him? My neighbor is good, other people are crazy themselves .

## جینار

ب گۆتنا خەلکێ
جیناری من دین ئە
سەری تژی تووز ئە
کورک تژی بین ئە

ئیرۆ چوومە جەم وی
بوو دلێ من تەزە
کمەک سا من گەپ کر
گەپێنە خوەشمەزە

سۆلێ وی دریان ئە
بەند سۆلان ڤە نە
کەنن وی بیرەفش ئە
کۆڤن وی کەڤنە نە

وا خەلکانا سا چێ
ل جەم وی نامینن
جیناری من ڕند ئە
وانا بخوە دینن

## همسایه

به گفته مردم ، همسایه من دیوانه است ؛ سرش پر از گرد و غبار است و جوراب هایش بو می دهند. کفش هایش پاره اند و بند کفش هایش باز است . خنده اش زیبا نیست و لباس هایش کهنه اند . امروز پیش او رفتم و دلم تازه شد . کمی برایم حرف های شیرین زد . چرا مردم پیش او نمی مانند ؟ همسایه من خوب است ، اینها خودشان دیوانه اند.

## Minminîkan

Minminîkan temaŞ kin
Çerre gulan bîn dikin
Natî gulan birefŞ in
Kovni xwe biçîn dikin

Li refŞî xwe kêm nînin
Ji serçan û bilbilan
Xef û xûlin gep naken
Mame li wî karî wan

Gepî dilî wan pirre
Torîm haka namînin
Rojek natî bilbilan
Li nav daran dixwînin

## Butterflies

Watch the butterflies! How to smell the flowers. How to bi pretty as well as flowers and how to decorates to their clothes. His pretty isn't lower than the starling and the nightingale beauty, but they are quiet. I've been in this job. They have a lot of Heartline. I hope to they don't stay like this time. They will sing like a nightingale in the trees .

## منمنيكان

منمنيكان تەماش كن
چەرِە گولان بين دكن
ناتى گولان برەفش ئن
كۆڤن خوە بچين دكن

ل رِەفشى خوە كێم نينن
ژ سەرچان و بلبلان
خەف و خوولن گەپ ناكەن
مامە ل وى كارى وان

گەپى دلى وان پرِە
تۆريم هاكا نامينن
رِۆژەک ناتى بلبلان
ل ناڤ داران دخوينن

## پروانه ها

پروانه ها را تماشا کنید ! که چگونه گل ها را بو می کنند . مثل گلها قشنگند و لباس هایشان را تزیین می کنند . در قشنگی از سار و بلبل کم نیستند ، اما ساکت و آرام اند . من در این کارشان مانده ام . حرف دل آنها زیاد است . امیدوارم این طور نمانند. آنها روزی مثل بلبل در میان درختان می‌خوانند.

## Dû Dar

Li ortî cadêkê darek hişîn bû
Çav li jûr û ji asimîn kûtel çû

Hişînya xwe rû li xedê bela kir
Li temûzê sa rêçûyan sêya kir

Darek haka peyda nebû li refşê
Ne ber bi wî bivir hatin ne tefşê

Li paylî wî darek qiçik li jîr ma
Li karên qiçik qiçik hîsîr ma

Li ortî rê xwe şev û roj pan dikir
Bîçikê xwe li çavî xelkan dikir

Iro cînarek çû bivir bikirrê
Bi destî cînari dare bû gorrê

## Two trees

in a street, a tree grew up. His eyes upward, and went up the sky. He offer his green face to God, he was spread and shade in summer for pedestrians. Somebody Didn't see a tree as well as it in beauty. any axes didn't come to it. Another small tree was down on his side and was captured his finger in each eyes. My neighbor Went to buy an  ax. The neighbor make it bald .

## دوو دار

ل ئۆرتی جادێکێ دارەک هشین بوو
چاڤ ل ژوور و ژ ئاسمین کووتەل چوو

هشینیا خوە ڕوو ل خەدێ بەلا کر
ل تەمووزێ سا ڕێچوویان سێیا کر

دارەک هاکا پەیدا نەبوو ل ڕەفشێ
نە بەر ب وی بڤر هاتن نە تەفشێ

ل پایلی وی دارەک قچک ل ژێر ما
ل کارێن قچک قچک هیسیر ما

ل ئۆرتی ڕێ خوە شەڤ و ڕۆژ پان دکر
بیچکێ خوە ل چاڤێ خەلکان دکر

ئرۆ جینارەک چوو بڤر بکڕێ
ب دەستی جینار دارە بوو گۆڕێ

## دو درخت

توی یک خیابان یک درخت سبز شد . چشم هایش رو به بالا بود و از آسمان بالا رفت . او سرسبزی اش را رو به خدا ، گسترانید و در تابستان برای عابران سایه داد . این گونه درختی در زیبایی پیدا نشد . به سمت او نه تبر آمد و نه تیشه . در کنار او درختی دیگر پایین ماند و به کارهای کوچک کوچک اسیر شد . خود را شب و روز توی راه پهن می کرد و انگشت به چشم مردم می کرد . امروز یک همسایه رفت تا تبر بخرد . آن درخت به دست همسایه کچل شد .

## Bi hevra

Cotek solan bi rengek
Li hevdi tekya dane
Li rê bi hevra çûne
Bi hevra vestîyane

Bi hevra ne Şev û roj
Li berf û li baranê
Li kûtel û li Şîbe
Li ayŞê û dûlanê

Cotê solan hakane
Ji iŞqi xwe sar nabin
Natî mêran û jinan
Bi hevra zû qar nabin

## Together

A pair of shoes to a color, have to rely on. they have gone through together, and together have been exhausted. Together in day and night and Together in the snow and rainy, Together in uphill and downhill, Together in dry and wet wind. These are a pair of shoes that are not cold in their love. They do not force it ,together like women and men .

## ب هەڤرا

جۆتەک سۆلان ب ڕەنگەک
ل هەڤ تەکیا دانە
ل ڕێ ب هەڤرا چوونە
ب هەڤرا ڤەستییانە

ب هەڤرا نە شەڤ و ڕۆژ
ل بەرف و ل بارانێ
ل کووتەل و ل شیبە
ل ئایشێ و دوولانێ

جۆتێ سۆلان هاکانە
ژ ئشق خوە سار نابن
ناتی مێران و ژنان
ب هەڤرا زوو قار نابن

## با هم

یک جفت کفش به یک رنگ ، به هم تکیه داده اند . توی راه با هم رفته اند و با هم خسته شده اند . شب و روز باهم اند ؛ چه در برف و باران ، توی سربالایی و سراشیبی ، توی باد خشک و باد مرطوب . جفت کفش ها این گونه اند که از عشق شان سرد نمی‌شوند . آنها مثل زنان و مردان ، زود با هم قهر نمی کنند .

## Demsala firrînê

Natî sêvek hiŞîn im
Li ermanca soran im
Natî çîle çûçikek
Firrîna xwe nizanim

Natî dilî bilbilek
Ez dixwazim bixwînim
Natî gulan ve dibim
Gul pidikek namînim

Li demsala firrînê
Li demsala ve bûnê
Ez ji xwe pirr ditirsim
Ji mayîn û xewçûnê

## Flying season

I am like a green apple in wish of reds. I am like a Sparrow chick that do not know fly. I want to sing like a nightingale heart. a day I will be flower and I do not stay species of buds. In the season of flying and season of to be flowers, so I'm afraid of staying and falling asleep .

## دەمسالا فڕینێ

ناتی سێڤەک هشین ئم
ل ئەرمانجا سۆران ئم
ناتی چیلە چووچکەک
فڕینا خوە نزانم

ناتی دلی بلبلەک
ئەز دخوازم بخوینم
ناتی گولان ڤە دبم
گول پدکەک نامینم

ل دەمسالا فڕینێ
ل دەمسالا ڤە بوونێ
ئەز ژ خوە پڕ دترسم
ژ مایین و خەوچوونێ

## فصل پرواز کردن

مثل یک سیب سبز هستم که در آرزوی قرمزهایم . مثل جوجه گنجشکی هستم که پرواز را بلد نیستم . مثل دل یک بلبل می‌خواهم بخوانم . من هم روزی گل خواهم شد و این گونه جوانه نمی مانم . در فصل پرواز کردن ، در فصل گل شدن ، از خودم بسیار می ترسم ، از ماندن و خواب رفتن .

## Bi tenê

Ez bi tenê hişîn bûm
Li ortî bilwarekê
Li ortî şerek xerîb
Nîzikî bazarekê

Minminîk û mişezer
Xweng û birayê min in
Ez gulek im tenê me
Li min serek naxinin

Ji wan mame bêxeber
Li rê maye çavê min
Li ku ne xweng û bira
Li ku ne di bavê min

## Only

I was grew alone in the middle of a boulevard, in a strange city, near a market. Bees and butterflies, are my siblings. They not call on me and I'm alone rose. I am Remained unaware of them and my eye in way of them. Where are my brother and sister? Where are my parents ?

## ب تەنێ

ئەز ب تەنێ هشین بووم
ل ئۆرتی بلوارەکێ
ل ئۆرتی شەرەک غەریب
نیزکی بازارەکێ

منمنیک و مشەزەر
خوەنگ و برایێ من ئن
ئەز گولەک ئم تەنێ مە
ل من سەرەک ناخنن

ژ وان مامە بێخەبەر
ل رِێ مایە چاڤێ من
ل کو نە خوەنگ و برا
ل کو نە د باڤێ من

## تنها

من به تنهایی در میان یک بلوار ، در یک شهر غریب ، نزدیک یک بازار ، سبز شدم . زنبور و پروانه ، خواهر و برادر من هستند . من یک گل تنهایم و آنها سری به من نمی زنند . از آنها بی خبرم و چشمم به راه مانده است . خواهر و برادرم کجایند ؟ کجایند پدر و مادرم ؟

## Çav û Tav

Va Şevana tarîn e
Va Şevana dirêj in
Çima xefin birano
Çima gepek nabêjin

Werin dengê xwe berdin
Bira tarî nemîne
Bira sibe zû bê
Ku çav tavê bibîne

Xwedê rê dane ber we
Xwedê sa we çav daye
Sa rîya xwe peyda kin
Ji nûra xwe tav daye

Werin tavê xwe bang kin
Va Şevê reŞ ser kevê
Hûn ji xwedê Bixwazin
Va tava zû verkeve

## Eye and sun

This nights are dark and long. Oh Brothers! Why not say something and why you are quiet? Let free your voice to dark did not leave, until the morning, come early and see the sun in our eyes! Let free our voice to go a dark night, and ask God that the sun will rise soon .

## چاڤ و تاڤ

ڤا شەڤانا تارین ئە
ڤا شەڤانا درێژ ئن
چما خەفن برانۆ
چما گەپەک نابێژن

وەرن دەنگێ خوە بەردن
برا تاری نەمینە
برا سبە زوو بێ
کو چاڤ تاڤێ ببینە

خوەدێ رێ دانە بەر وە
خوەدێ سا وە چاڤ دایە
سا رێیا خوە پەیدا کن
ژ نوورا خوە تاڤ دایە

وەرن تاڤێ خوە بانگ کن
ڤا شەڤێ رەش سەر کەڤێ
هوون ژ خوەدێ بخوازن
ڤا تاڤا زوو ڤەرکەڤە

## چشم و آفتاب

این شب ها تاریکند . این شب ها طولانی اند . برادران ! چرا ساکتید و چرا چیزی نمی گویید ؟ بیایید صدای تان را رها کنید تا تاریکی نماند ، تا صبح ، زود بیاید و چشم ما آفتاب را ببیند ! خدا راه را به شما نشان داده است و برای این که راه خود را پیدا کنید ، از نور خودش خورشید داده است . بیایید صدا کنیم تا شب تیره سر شود و از خدا بخواهیم که این خورشید زودتر طلوع کند.

## Pêşgotin

Li her derê ku ziman û pênûs nikare bi asayî rastîyan bîne ser zimîn, li wir helbest tê qadê. Gelek caran, helbestek dikare ji karê sedan leşker bi kêrtir be. Helbest dikare him wek neynikekê rastîyên civakê nîşan bide,him jî ziman biparêze,dîrokê vebibêje, û hwd.

Di wêjeya helbestkîya Kurdîya Kurmancî da helbestvanên pirr mezin hene : *Ehmedê Xanî,Feqîyê Teyran,Melayê Cizîrî,Ceferqulîyê Zengilî,Elî Herîrî,Cegerxwîn, ...*

Wek mînak, drama *Mem û Zîn* ku di sala 1694`an da bi destê *Ehmedê Xanî* hatiye nivîsîn, kariye gelek xalên girîng ên çand,dîrok,… civaka Kurdan ji bahoz û tofanên dîrokî biparêze.

Îro zimanê Kurdîya Kurmancî li Xorasanê di rewşeka taybet da ye û pêdivîya wê heye ku lê xwedî derkevin. Ev yek jî barekî giran li ser milên ronakbîrên Kurd bi taybet ên li Xorasanê ye. Birêz ***Elewîferd*** yek ji ronakbîrên Kurdên Kurmanc ên Xorasanê ye ku helbestên xwe bi Kurdî dibêje û haya wî ji astengên li ser rîya Kurdîya Kurmancî heye.

Eger Kurd bixwe, bi gepkirin bi zimanên ne Kurdî bi hevdu ra, zimanê Kurdî nekujin, zimanê Kurdî namire. Divê nivîsar,helbest,destan,çîrok,… xwe bi Kurdî binivîsin û bi vî awayî di rewşa heyî da zimanê xwe biparêzin . Em wisan nekin, em ê bibin sûcdarê zimankujiyê û nifşên pêşerojê yê qet me nebaxşînin.

Azad MAKÛYÎ
Tehran / 2012

## گۆتن

ل هەر دەرێ کو زمان و پێنووس نکارە ب ئاسایی ڕاستییان بینە سەر زمین، ل ور هەلبەست تێ قادێ. گەلەک جاران، هەلبەستەک دکارە ژ کارێ سەدان لەشکەر ب کێرتر بە. هەلبەست دکارە هم وەک نەینکەکێ ڕاستییێن جڤاکێ نیشان بدە،هم ژی زمان بپارێزە،دیرۆکێ ڤەبێژە، و هود. د وێژەیا هەلبەستکیا کوردییا کورمانجی دا هەلبەستڤانێن پڕ مەزن هەنە : ئەهمەدێ خانی،فەقییێ تەیران،مەلایێ جزیری،جەفەرقولییێ زەنگلی،ئەلی هریری، جەگەرخوین، ...

وەک میناک، دراما مەم و زین کو د سالا ١٦٩۴`ئان دا ب دەستێ ئەهمەدێ خانی هاتیە نڤیسین، کاریە گەلەک خالێن گرینگ ئێن چاند،دیرۆک،... جڤاکا کوردان ژ باهۆز و تۆفانێن دیرۆکی بپارێزە.

ئیرۆ زمانێ کوردییا کورمانجی ل خۆراسانێ د ڕەوشەکا تایبەت دا یە و پێدڤییا وێ هەیە کو لێ خوەدی دەرکەڤن. ئەڤ یەک ژی بارەکی گران ل سەر ملێن ڕۆناکبیرێن کورد ب تایبەت ئێن ل خۆراسانێ یە. بریێز ئەلەوی فەرد یەک ژ ڕۆناکبیرێن کوردێن کورمانج ئێن خۆراسانێ یە کو هەلبەستێن خوە ب کوردی دبێژە و هایا وی ژ ئاستەنگێن ل سەر ڕێیا کوردییا کورمانجی هەیە.

ئەگەر کورد بخوە، ب گەپکرن ب زمانێن نە کوردی ب هەڤدو ڕا، زمانێ کوردی نەکوژن، زمانێ کوردی نامرە. دڤێ نڤیسار،هەلبەست،دەستان،چ یرۆک،... خوە ب کوردی بنڤیسن و ب ڤی ئاوایی د ڕەوشا هەیی دا زمانێ خوە بپارێزن . ئەم وسان نەکن، ئەم ئێ ببن سووجدارێ زمانکوژیێ و نفشێن پێشەرۆژێ یێ قەت مە نەباخشینن.

ئازاد ماکوویی
تهران / ٢٠١٢

